(د.عەلی شەریعەتی) واتەنی ناوی دایك وباوك و خۆشەویستترین کەسەکانی خۆشیت لە تاو وەحشەناکییەکەی لە بیر دەچێتەوە!". ئەم پیاوە دەگمەنە لە ئاوا وەزعێکدا بەمجۆرە نزا بۆ دەردەداران دەکات*:

خوایا! ئەی کەسی مەردمی هەژار! ئاگا لە دڵی دڵسۆزیی بێدەس!
خوایا! بە دڵ ئەو باوکە نەدارە برسیی ئەی بوێرێ ژەمەن بۆ ژەمەن
ڕۆڵەی تاقانەی، نەخۆشەو دوختۆر نێژێ: گ* ژەمێ، کەواوی پێ بەن
خوایە! بە دڵ ئەو دایکە برسیە مەقاش پلێکی لێ هەڵ ناکەنێ
ڕۆڵەی بەر مەمکەی لە سەر باوەشی لە برسییەتیا گیانی دەر ئەچێ
خوایە بەدڵ ئەو کرێکارانە کولانەیکیان هەس لە گۆشەێکەوە،
لە هۆدەییێکی عەمارەتێکا کە ماڵ تەواو بوو، فەرموو دەرەوە
خوا گیانی! بە دڵ ئەو منالآنە هەر بە ئیمرڕۆژ و صۆزیی ئەی بوێرن
دڵخوەشن: دایك و باوکی ماندوویان ئاخری، چێشتیان لە دەر بۆ تێرن
خوایە! بە دڵی ڕێبواری تەنیا ناکەس لە کەسو یارانی تاران
تەواو وەتەنی، کولانە جنیێ "کۆساڵانی لێ بوە بە تاران"
ئەی خوایە! بە دڵ ئەو هەتیوانە رووتو، پاپەتییو، برسیینو بێکەس لە هەژاریی، کەس،
لوتێکیان پیا نایرێ، لە خەڵکی خاك پەرسی پەس
ئەی خوایە بەدڵ بێکەسی ژاکاو هەر دەری ئەکەن ڕوو لە هەر لایەکات
لە بەر ئیترییسی خەڵکی دنیادۆس منالٚ مەعسوومیش پەڵی بۆ ئەخات
خوایە بە بەختی خەڵکی خەڵەتیاگ لە شوێنی خەون خەیاڵان ڕەتاو
تەمو مژیان پێ هەوری ڕەحمەتە گەنکاویان لە لا یانێ نانو ئاو
خوا! بە هەژاری مەردمێ هەژار چرای ئیقباڵیان وەك زووسان، سەردە
"چۆنی بێ، با وا بێ"، یا لە بێهێزیی یا نە نازنن دەردیان چ دەردە
خوا! بە مەزڵوومیی تەواوی بەشەر لە هەر لا دییلن، سەر لێ شێواون

---

* ) شیعری (باخە نامە)، دیوانی شعری : دیاریێ بۆ یاران، کاك ئەحمەدی موفتی زادە، ل٥١-٥٢.

* گ ژەمێ، کەواوی پێ بەن: گشت ژەمێك کەبابی بەنێ؟

شەیاتینی ژین زاڵن لە سەریان     ئەمان وەك ماڵات، ئەوان قەساون
خوایا! بە "قدر"ی مانی ڕەمەزان     بە خەڵاتی نوور، قورئانی پیرۆز
بەوەی، سەرچاوەی نوورت خەڵات کرد     تەنیا پێشڕەوی ڕێزانی دڵسۆز
بگەی فریای ئەو "باخە نەمامە"     ناومە و ناتوانم بییگەینم وە بەر
لە هەر ئافاتێ خۆت بی پارێزە     تا شین کا وشکان کولۆڵیی بەشەر

لێرە بەدوا دەچمە سەر شیعری (ئیکسیری گەورە) کە وا دەزانم لەم پارچە شیعرەدا (کاك ئەحمەد) زۆر نهێنی و ڕازی ئیمان و قورئان و ئەرکی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر و داواکارییەکانی پەروەردگار لە موسوڵمانان دەخاتە ڕوو، بەجۆرێك هەر وێستگەیەك لەو شیعرە دەرخستی ڕازێك و لابردنی پەردەیەکە!

لەم شیعرەیدا (کاك ئەحمەد) بە کورتی و پوختی و لەڕێگەی وەسیلەیەکەوە، کە خۆی لە پێناسەیدا دەفەرمووێت: شیعر بریتییە لە وەسیلەیەك بۆئەوەی ئەو مەبەستانەی لە دەروونەدان و بە ڕێگەی ئاسایی دەرنابڕێن لەم ڕێگەوە دەریانبڕێت. ئەو لەم بەیتانەدا هەمان کاریکردووە، کە دەیانخوێنیتەوە سەیردەکەین دونیایەك لە وتە و ئامۆژگاری دیکە لە پشت ئەو وتەو ئامۆژگاری و وشانەوە وەستاون کە دەیانبینیت! ئەم شیعرە بریتییە لە ئامانجی کار و پرۆگرامی... بریتییە لە نەخشەڕێگایەك بۆئەوەی لەڕێگەی ژیان لەگەڵ هەژاراندا بگەیتە کاروانی صاڵحان، بۆئەوەی لە ڕێگەی موحیبەتەوە تامو چێژی ئیمان بکەیت و ساتەکانی تەمەنت لە ناو نووری خۆشەویستیدا بەسەر بەریت... ئەم دێڕانەی (ئیکسیری گەورە) تەفسیر و کەشفکردنی دیوە نادیارەکانی قورئان و ڕاڤەکردنی ئایەتی ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ المدثر٤. و کەشفی ئەسراری نبووەتە!

ئێمە لێرەدا زۆر بە کورتی هەوڵدەدەین ڕاڤەی ئەو شیعرە بکەین و ئەوەندەی دەکرێت شەرحی حاڵ و تێگەیشتنی ژیانی (کاك ئەحمەد) بکەینەوە، چونکە زۆرێك لەوانەی لەم بەیتانەدا باسیکردووە ئێمە لە کتێب و نووسینەکانی پێشوماندا باسمانکردووە:

## ئیکسیری گەورە

رۆڵەم هاورێیەی دنیا و قیامەتم　　به دڵ گوێ بگرە بۆ نەسیحەتم
ڕازرێ، تازە من دوای پەنجا ساڵ تێگەییم، ئەویش بە حاڵ و نەحاڵ
خۆشە تۆ هەرتا جوانی حاڵی بیی　　تا پوختە و قاڵی موسوڵمانی بیی

یەکێك لەگەورەییەکانی ئەم پیاوە ئەوەیە، هەمیشە و بە درێژای کاری وا هەستی کردووە، و بە جۆرێك مامەڵەی کردووە، کە جگەلەوەی تەواوی موسوڵمانان خوشك و برای ئیمانین، لە هەمان کاتدا وەك منداڵی خۆی تەماشایکردوون! جا نهێنی بەم شێوە تەماشاکردنە لەوەدایە، کە هەموو باوکێك لائیرادی هەست بە بەرپرسیارێتییەکی قوڵ دەکات بەرامبەر بە منداڵەکانی، بۆیە بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدایە ئەوەی بە خۆیەتی بیداتە ئەوان و ئەوان رازی بکات، وەك ئەوەی دەڵێن: تەنها باوك و دایك حەزدەکات رۆڵەکەی لە خۆی باشتر بێت، ئەگەر نا هیچ کەس پێی خۆشنییە کەس لەو باشتربێ ! جگە لەوەش ئەوە باوکە بەردەوام کاردەکات و ماندو دەبێت بۆئەوەی رۆڵەکەی پێبگات بەبێئەوەی چاوەڕێی هیچ پاداشت و بەرامبەرێك بێت. ئەوە باوکە ئامادەیە لەسەر رۆڵەکانی هەزاران دەردی سەری و نارەحەتی قبوڵ بکات بەمەرجێك کارێك نەکات و شتێك نەڵێت رۆڵەکانی بخاتە ئەزییەت و ئازارەوە. نهێنییەکی دیکەی ئەوەیە سیفەتی باوك بەجۆرێکە هەرگیز ئامادە نییە خیانەت و ناڕەوایی بەرامبەر بە (ڕۆڵە)ی خۆی بکات، کەواتە (کاك ئەحمەد) هەر لەسەرەتاوە دەڵێت: من بەرپرسیارم بەرامبەر هەمووتان و کارم بۆ باشکردنی حاڵ و گوزەرانی ئێوەیە(لە سەرەتادا چەند نمونەیەکما خستە ڕوو کە ئەمە دەسەلمێنن)، هەوەها هەرگیز ئامادەیم نەبووە و ناشمبێت بچوکترین خیانەتانت بەرامبەر بکەم، ئامادەم (١٠ساڵ) زەجرو عەزاب بچێژم، بەڵام یەك لەحزەش خیانەتان لێناکەم.. بۆیە بەدڵ گوێبگرە بۆ نەسییەحەتم... ئەوەی من دوای پەنجا ساڵ لە خەبات و شەونخونی و تێکۆشان و کۆبوونەوە و وورد بوونەوەرەو شار و شار و، وڵاتە و وڵات تێگەییم بە حاڵ و نەحاڵ، چونکە ئەگەر وەك خۆی تێبگەشتمایە حاڵم وەك ئەم حاڵەی ئێستا نەدەبوو، ئانەوەیە گەورەی ئەم پیاوە هەر لەسەرتاوە ئیعتراف دەکات، کە قورسترین شت لای مرۆڤەکان بریتییەلە (ئیعتراف)کردن، بە بۆچوونی بەندە گەورەی (دۆعا کردن) هەرئەوەیە، کە تۆ لەبەردەم خوای گەورە (ئیعتراف)دەکەیت! تەنها مرۆڤێکی دانپێدانەریە بەسە بۆئەوەی تام و چێژی هەموو ئیمان و سەرکەوتن بکەیت، نهێنی گەورەی (استغفر الله) ئەم نوکتەیەیە، واتە خودایا دان دەنێم بەو هەموو ئەو هەڵانەی کەردومە، چونکە مرۆڤ بە سروشتی خۆی هەمیشە هەوڵدەدات ئەو هەڵە و تاوانانەی کردوویەتی بیخاتە

سەرشانی کەسێکی دیکەو خۆی لێ بێبەری بکات! جا وەك (سەید قوتب)ی رەحمەتی باسی دەکات: تاکی موسوڵمان تەنها واز لەو خووە بهێنێت، کە هەرچی بەسەردا دێت خۆی بە بەرپرسیار و کەمتەر خەم نازانێت بەسە بۆئەوەی دەستبکات بە هەڵسانەوە و رزگار بوونی، بۆیە دانپێدانان و ئیعتراف کردن بەوەی کردووتە ئەوەندە گەورەیە، هەر ئەو کاتەی دانت پێدانا ئیتر ساتەکانی گەورە بوون و سەرکەوتنت دەست پێدەکات*. گەورەییەکی دیکەی ئەوەیە، کە ئەو زانست و زانیاری و ئەزموونانەی خۆی تێگەییوە و پێیگەییەوە ڕاستەوخۆ بە رۆڵەکانی دەگەیەنێت، چونکە دەیەوێت تا گەنجی ئەوە وەربگرە من بەو هەموو تەمەنەوە وەرمگرتووە:

(خۆشە تۆ هەرتا جوانی حاڵی بیی، تا پوختە و قاڵی مۆسوڵمانی بیی)...

رۆڵەم ئەزانی: لە دوای تێگەیین بە دڵە زۆردارو بە تیین

بەڵام چ ڕازە: برێ دڵ، سازن بۆ قەبوڵی حەق، برێ لەجبازن؟

برێ ئەخلاق، یان قسە، یا ڕەفتار یا ڕەفاقەت، یا عادەت، یا ژیوار

مایەی ئەخۆشیی یا ساقیین بۆ دڵ لادان لە زۆریان گرانە و موشکڵ

چتێ کە لە ناو ئەوانا گشتی جوانترە و زۆرتر بردو برشتی،

"خۆشەویسیی یە"و، لەوەلا ئیتر ناگاتە گەردی پایا هیچی تر

هەروەك دڵێ چۆڵ لە خۆشەویستی ئامادەس بۆ صەد ئەخۆشیی و پیسیی

لەم بەیتەوە وردە دێتە سەر ئەصڵی مەتڵەب و مەبەستی، ئەوە دەخاتە ڕوو کە عەقڵ و دڵ دوو دەزگای دامەزرێنەری ئەخلاقی مرۆڤن و دەبێ ئاگاداریان بیت، ئیمان کە باسی ئەساییە سەرەتا دەبێت بە عەقڵ لێی تێبگەیت دوای ئەوە ئیتر کاری دڵە و دەبێت ئەو تێگەیینە بۆ عەقڵ و زهن تەحویل ببێت و، لەوێ جێگیر ببێ!ئەوەیە نهێنی ئەوەی کۆمەڵێك لە نێوان عەقیدە و بیرو باوەڕەکاندا ئەمبەر و ئەوبەر دەکەن، چونکە ئەوان نەیانتوانییوە لە زهنەوە هەنگاو هەڵێنن بەرەو قەلب. خۆشەویستیش هەمان شێوە دەبێ غەریزە تێپەڕێنێت، چونکە گەورەترین نیعمەتە و هیچ شتێك ناگات بە تۆزی پێیدا("خۆشەویسیی یە"و، لەوەلا ئیتر ناگاتە گەردی پایا هیچی تر).

جا تەواوی دەرس و ئامۆژگاریەکانی ئەم پیاوە زانا و دانا و عارفە بۆ یەك مەبەست بوون، تەنها لەبەر یەك کەلیمەیە، کە بایەخی هەموو قسەیەکی هەیە:

---

* ) تەفسیری سورەتی (النصر)بخوێنەوە، لەوێدا دەردەکەوێت پەیوەندی (استغفرالله) و (نصر) چییە!

(ڕۆڵەی هاوڕاز و هاو گرفتاریم پێم وایە: تەواو دەرس و مۆچیاریم
گشتی هاوقیمەت هەر یەك کەلیمەس، یانێ"محبت"، ئەرزش گشتی هەس)

بەڵام بەو شەرتەی ئەم خۆشەویستییە غەریزی نەبێت، واتە لە دونیایی عەقڵ و هەوادا نەسوڕێتەوە، ئەگەروا بوو ئەوە لەبەر خۆویستییە نەك خۆشەویستی:

محبت هەر کەس یا هەرچ کەبێ بەو شەرتە: "تەنیا غەریزی" نەبێ
چوونکە خۆش ویستن ئەر هەر غەریزییس لە حەقیقەتا لە بەر"خۆویستیی"س
زۆرن محبت کە لە خۆ ویستیین بۆ گەل، بۆ وڵات، مەزهەبن حەتا دین!
برێ بەش لە ئەو نوورە نەبردوو لە ناو دوکەڵی هەوەسا ون بوو
خوا و پێغەمەری "خو"یان خۆش ئەوێ ئەر خۆش ویستنیان بە درۆ نەوێ
لە دوای ئەو شەرتە وریابە لە دوا عەقڵی ڕێ شێواو ئارەزوو لێ داو،
عەقڵی گزیری غەریزەی جادوو عەقڵی تەن و مەن و ترازوو،
بە"جەدەل"سەرت لێ نەشێوێنێ بە فێڵ قولت لێ بە فول نەنوێنێ

لە وێستگە یەکی دیکەدا هەڵویستەیەك لەسەر کارەکانی ڕابردووی خۆی و هاوڕێکانی دەکات، ئەسەف بۆ ئەوە دەخوات کە تێکۆشایە نەختاڵێك بە خۆشەویستی خەڵکی بگەشتایە! جا ئەم ئیعترافەی وەك دواتر ڕوونی دەکاتەوە بە مانایی ئەوەنییە، کارو تێکۆشانەکانی پێشتری بایەخی نەبووبێت، نا قسەکە لەوەیە، کە لە نێوان زانست و پەروەردەدا، دەبێت پەروەردە پێشبخرێت،(لە بەشەکانی پێشتردا درێژتر باسمانکرد)، ڕاستە زانست پایەیەکی ئەسڵییە و گرنگە، بەڵام (لە دیینا ـ تعلیم ـ پایەی ئەسڵییە، وەلێ جێگەی وا لە پاش ـ تزکیە ـ). بە بۆچوونی (موفتی زادە) مرۆڤ هەرچەند زانابیت، ئەگەر خۆشەویستی و ئەخلاقی لەگەڵدا نەبێت، کە هەردووکیان دەچنە ژێر چەتری پەروەردە و (تەزکی)یەوە، ئەوە لە جیاتی ئەوەی خزمەت بە مرۆڤایەتی بکەن بە پێچەوانەوە دەبنە مایەی بەڵاو موسیبەت و دەرد بۆ بەشەرییەت! (ئاخر ئەزانی: نادروسن هەر چەن زۆتر بزانێ زیاتر ئەددا پەن). جا کە دێتە سەر باسی کار و تێکۆشانەکانی خۆی و هاوەڵانی وا خۆی دەردەخات بە تەواوەتی بەم یاسایە کاری نەکردووە، دەڵێت:

ئاخ لە جێ ئەو گش حەچەل و قاڵە    بفامیای ئەم چەنای چەنساڵە:

تێکۆشم: خۆم و هەموو هاواڵێ    بە"خۆشەوییسیی"بگەین نەختاڵێ

وەك وتمان ئەمە مانای ئەوە نییە، کارەکانی پێشوتری بێکەڵ بوو، تا ئەوانیش هەر باش بوون و کاریگەری خۆیان هەبووە(ئەڵبەت ناڵێم ئەو باسانە زیادیین، بەڵام بە بایەق لە پلەی دوایین:). جگە لەوەش خۆ کار لەکار نەترازاوە و ئیتر ناتوانین کار بکەین لەبەرئەوەی لەسەرەتاوە بە تەواوەتی کارمان بەم یاسایە نەکردووە، تا هیوای قەرەبووکردنەوە( هەر هەس "ماسیی هەر وەختێ بیگریی هەر تازەس".

لێرە بەدواوە وێستگەیەکی دیکە دەست پێدەکات و بە کورتی، بەڵام بە قوڵی دەربارەی جیاوازی (کوفر) و (ئیمان) دەنووسێت*، کە ئەمیش بەهەمانشێوە وەك شەرحێکە بۆئەوەی موسوڵمانان باش حاڵی بن، پەروەردە و ئەخلاق و عەمەلی صالح چەنێك ئەرزشدارە:

گیانە دوو ڕیان کافری و ئیمانچ بۆ کەم حاڵی چ بۆ فرەزان،

خۆ بە نەزانیین یا زانیین نیە    بەڵکە بە انصاف یا لاساری یە

خوا بە کەسانێ، "کافر"یا"مؤمن"    ئێژێ، حسساویی لە حەق حاڵی بن

یانی: تا پلەی"لە حەق تێگەیین"    ئیمان و کافر، لە یەك جیا نیین

پاش حاڵی بوونە، یەکێ هەوەسی    ئەی کێشی بەرەو باری ناکەسیی

یەکتر، دڵی، دیل هەوەسگەل نیە    ئامادەی قەبوڵ حەق و ڕاسی یە

ئەگەر دڵ بدەیی بە باسی قورئان    "کافر" کەسێکە لە زلەیی مان

جا یا هەر ئیسە ماقوڵ و زلەیا بۆی ئەپێوێ پلە وە پلە

چونکە ئەوییینی ئەر ئیمان بێری    ئەشێ"گەورەیی" بە خوا بسپێری

ئەبی ببێتە هاوشان هەژاران    توێڵ بنێیتە جێپێ ئەداران

"کما امن السفها"ت ژنەوت لە دەم ئەفامگەل زلە دەرکەوت ـ

ئەنجا، لە ناحەق، نادا وچانێ چونکە حەق، بۆ خوەی، وەشەڕ ئەزانیی

---

*) ئێمەلێرەدا بە پێویست نازانین دووبارە شەرحی ئەم باسە بکەینەوە، بەڵکو خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ کتێبی دووە بە ناویشانی(کاك ئەحمەدی موفتی زادە، هەوڵێك بۆ ناساندنی بەشێك لە بۆچوونە پەروەردەیی، و فەلسەفی و فیکرییەکانی)، نووسینی سەروەت عەبدوڵا، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ۲۰۱۱. کە لەوێدا بە درێژ ئەم باسە ڕوونکراوەتەوە.

جا هەر چەن تەنیا دەسەی "مترفیین" لە هەر دەورانێ دوژمنن بۆ دین
چۆن بۆ ئەتبینی: لە "مکە" زۆرێ تا بەینێ ئیمان نایرن، وە جۆرێ؟
زۆریەی لە خەڵك، لە ترسی زۆرکار ناوێرن بچن بەرەو حەق یەکجار
یا رێك ناکەوێ: لە سامی دژمن بۆ مەبەستی حەق جارجار گوێ بگرن
یا هەر سەفسەتە و درۆی دەسدارگەل لە حەق، کول ئەکا چاوی عەقڵی گەل
کارێکیان ئەکرد: بە"پێشداوەری" مەردمیش بکەن لە حەق بێوەریی:
بۆ قسەی"شاعیر"،"جادوگەر"،"شێتگەل" کێ حازرە خۆی بخاتە حەچەڵ؟]

-------------

بەڵام ئەوی تر، هەوای "زلەیی" یانیە، یاکەی نای کا کەلەیی
کە تێگا لە حەق، یا خاو یا بە تاو بۆی ئەچێ، ئەکا چش لە نانو ئاو

پاش ئەم جیاکرییە، ئێستا کاتی ئەوەیە وەڵامی ئەو پرسیارە بزانین، بۆچی مرۆڤەکان ئاوا جیاواز دەردەچن و برێك ئامادەن حەق وەرگرن و لەبەرامبەر حەقەوە سەرنەوی بکەت، تەوێڵ دانەوێن و سەربخە سەر جێپێی هەژان، لەبەرامبەر خواوە کەس بەگەورە نەزانن و گەوری بە ئەو بسپێرن، بەڵام برێکی دیکە، خۆ زللە بگرن، ناحەق بە حەق بزانن و ناماقوڵ لە جێ ماقوڵ دانێنن و هەژاران بە نزم ببینن؟

((بۆ یەکێ وایەو یەکێتر ئاوا؟ تەنیا مەسەلەی"دڵ"ە ئاوا))

وەڵامەکەی دیارە تەنیا مەسەلەی (دڵ) لە ئاوا، ئەگەر دلگرتی و تیشکی موحیبەت چووە دڵەوە، ئەوکاتە دڵ دەبێتە مەنزلگەی ئەخلاق و ئیمان! جا بە پێچەوانەشەوە، هەرگیز وانەزانی بەبێ موحیبەت خۆشەویستی خوا بێتە دڵەوە، بەبێ موحیبەت ئەخلاق و ئیمان تەشریفاتییە، لە تەشریفاتا خوا حازر نییە:

هەر ئەناژە دڵ، ئاساق یا ساق بێ سین ئەکا یا خۆ بەرە و حەق ئەچێ
(نەك تەنیا کوفر و ئیمان، تەواوی بە دڵە: باری "خاسی و خراوی")
لە ناو هەرچێکا لە دڵ بە کارە "محبت" لە گش زۆرتر زۆردارە
تییشکی محبتێ دڵ ئە کا پڕ بار لە: ئەخلاقی باش، ئیمانی تەیار
پێت وانەبێ: بێ خۆشەویسی خوا لە ماڵی دڵ"ئیمان" هەڵ بکا

کەواتە ئەسڵی مەتڵەب لێرە زۆردیارە، وەك چرای ڕووناك تیشکی بەکارە:
((کەوا بوو، ڕۆحی مەبەستە: هەڵ بوون چرای "محبت" لە دڵ و دەروون))

دوای جێهێشتنی ئەم وێستگەیە، ئەمجار (موفتی زادە) هەنگاوەکانی بەرەو قوڵییەکانی باسەکە خێراتر دەکات، دوای ئەوەی ئەوە دەخاتە ڕوو کە مرۆڤەکان هەروەك چۆن لەباسی کوفر و ئیماندا جۆرجۆرن بە هەمان شێوە لە خۆشەویستیشدا جۆرجۆرن:

وەك لە مەسەلەی کوفرو ئیمانا زۆرتر مەردمان وە جۆرجۆر دانا،
بۆ کەحەببەتیش مەردم جۆرجۆرن: کرژ یا خاو، بەشدار لە کەم یا زۆرن

ئیتر لێرەدا دەگاتە ئەوەی وەڵامی ئەم دوو پرسیارە بداتەوە: ئەوە چی بکەیت تاوەکو بڵێسەی خۆشەویستیمان زیاد بکات و ئیمان بەهۆیەوە قالکات؟ چی بکەین بۆئەوەی ڕەگ و ڕیشە و سەیقەڵی خۆویستی و سستی و ناپاکی لە دڵ بکاتەوە و پاکی کاتەوە؟
((هەر بە ـ محبت ـ لە گشتیی زۆرتر سووسەی محبت ئەوێتە ئاگر"
چوونکە دڵیش وەك عەقڵ و لەش، کەم کەم لە هەر بارێکەوە، خوەی ئەکا مەحکەم))

لەو بەیتانەی سەرەوەدا وەڵامەکەی دەخاتە ڕوو، کە تەنها بە خودی خۆشەویستییە دەتوانین خۆشەویستی لە دڵدا مەحکەم بکەین! هەر بە خوشەویستییە دەتوانین سوسەی موحیبەت بکەینە ئاگر، جا لێرەدا زۆر جوان کاریکردووە، دەڵێن بە (سووسەی محبت)، (سووسە): سو ـ سو (واتە: دۆخی تیشکێکی کز و بێگیان، کە لە پەستا وەك هەڵبێ و دایبسێ دێتە بەرچاو)[4]، دەی هەر ئەو بەشە بچووکە گەشە دەکات و دەبێتە تیشکێکی کامڵ! جا لە دوو بەیتی دواتردا ڕوونتری دەکاتەوە و ئەوە دەخاتە ڕوو، ئەگەر دەتەوێت بە خۆشەویستی گەورە بگەیت ئەوا دەبێت بێشتر خۆشەویستی بچوکگەل ببڕێت!
((بە خوەشەویسیی بچووك فێرببیی ئەتوانی: بەرەو لای گەورەیش بچی))
پاشان دێت ڕەخنەیەکی جوان و ئەدەبانە لە هەندێك لە عارفگەل دەگرێت،؟ ئەوانەیان کە بڕوایان وایە، هەر دڵێك بە خۆشەویستی مەجازییەوە سەرقاڵببێت و تێوە بگلێت ئیتر ناتوانێت بەرەو

[4]) بڕوانە: ماجد مردوخ رۆحانی: فرهنگ (فرسی ـ کردی) دانشگاه کردستان، جلد دوم، چاپ اول، ١٣٨٦، ص١٤٧١.

عیشقی حەقیقی و خوای بڕوات. کاك ئەحمەد لەم دێڕانەدا بۆچوونی خۆی دەخاتە ڕوو، پێیوانییە هەر دڵێك عیشقی مەجازی تێچووی ئیتر بەرەو عیشقی حەقیقی ناڕوات، بەڵكو دەڵێت: دەكرێت دڵێك كە بە مەجازییەوە سەرقاڵە، ئەگەر ئەو خۆشەویستییەی ناپەسەند نەبێت و سنوری نەبەزاندبێت نەكەوتبێتە هەڵەوە دەگونجێت بەرەو حەقیقی و حوبی خوا بچێت.

بڕێ عارفگەل ـ خوایان لێ ڕازیی ـ وا ئەڕوانن بۆ عەشقی مەجازیی:

به مەجازێ ئالوودە نەبێ          دڵ، بۆ حەقیقیی ئامادە نەبێ.

(بەڵان ئیشتبان باوڕت یەبۆ:          "حەقییق بێ مەجاز، تاقییق نەمەبۆ"

هەر محەبەتێ نا پەسەن نەبێ          ئەگونجێ بەرە و حبی خوا بچێ

هە وەك ئەگونجێ: دڵی كۆك و ساز    بكاتە ئاوات بێیاریەی مەجاز)

---

ئەلغەرەز، ئەگەر بە ئاواتی: دڵ،          بە خوەشەویسیی جوانتر بی لە گوڵ

قاڵ بی بە حبی خودا و پێغەمبەر          تا چە پییسیە، لێ بچێتە دەر،

كەم كەم نێكۆشە تا وە محبت          لە بووچكترەو، دڵت بەیی عادەت.

---

ئێمە پێشتر ئەوەمان خستە ڕوو، كە بەبۆچوونی (كاك ئەحمەد) خۆشەویستیش جۆرجۆرە، ئێستا لێرەدا دێت لە ناو ئەو هەموو جۆرەدا (دوو جۆر)ی زۆر گرنگیان دیاریدەكات و لە بارەیانە قسە دەكات، كە مرۆڤ دەتوانێت بەهۆی ئەم دووانەوە تامو چێژی ئیمان و ژیان بكات و، لەم فەزا قەرباغ و پڕ لە بوغز و قینەدا، كە وەك بۆن بەبێ ویستی خۆت دێتە دڵتەوە و نارەحەت دەكات! دڵت ڕزگار بكەیت و ڕێگەی خوا و پێغەمبەری خوا(ﷺ) بدۆزیتەوە! ئارام ڕێ بگوزەرێنیت، ئاخر زۆرێك دەڵێن ئەوە چۆنە (موفتی زادە) توانی لەو (٨ساڵەی) زیندانی ئینفرادیدا بەرگە بگرێت و تەحەمولی ئەو هەموو ئەشكەنجە جەستەی و دەروونیە بكات؟ وەڵامەكەی تەنها بە لێورد بوونەوە و ژیان لەگەڵ بەرهەم و شەخسیەتیدا دەستدەكەوێت. ئاخر (كاك ئەحمەد) مەكۆی ڕق و قینی لە دڵیدا دەرهێنابوو، ئەو بە تەواوی موحیبەتە لەگەڵ ئەوانی دیكەدا دەژیا، هەموو تەمەنی بۆ خۆشەویستی پیاو چاك و هەژاران یەكلایكرد بوویەوە، ئەو

حوبی خوا و ئاین و پێغەمبەرەکەی بەجۆرێك چووبوویە دڵەوە هەرکاتێك ناوی پێغەمبەر(ﷺ) دەبرێت لەتاو فرمێسك و هەسنکی خۆشەویستی بۆ رەسول ناتوانێت درێژە بە قسە و باسەکانی بدات! هەر ئەم موحیبەتەیە دەبێتە دەرگای نەجات بۆیی و ژووره تاریك و نووتەکەکانی زیندان دەبێتە باخ و بێستان و گوڵوگوڵزار بۆی! من هیچ گومانێکم لەوەدا نییە موفتی زادە ژووری ئینفردی بۆ بۆتە باخ و بێستان ئەوەش بەم دەلیلانە:

یەکەم: لە قورئاندا خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْداً وَسَلَاماً عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾{الأنبياء٦٩}، واتە((کە ئیبراهیمیان گرت و فڕێیاندایە ناو ئاگرەکە، بە ئاگرەکەمان ووت: ئاگرەکە! سارە ببەرەوە و ببە بە مایەی سەلامەتی و زیان نەگەیشتن بە ئیبراهیم))[٥].هەموومان دەزانین هۆکاری ئەم سارکردن و سەلامەت بوونە تەنها لەبەرئەوە بوو، کە ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەر بێت) داعی دین و خۆشەویستی خوا و خەمخۆری هەژاران و نەداران و خاوەن پەیامی ئاسمانی بوو، دەی ئەگەر لەبەرئەم هۆکارانە ئاگری بەتینی بۆ بوویێتە شوێنێکی سەلامەت، خۆ هەمووی لە (موفتی زادەدا) بوونی هەیە! کێ دەتوانێت بڵێت داعی نەبوو؟ کێ دەڵێت باوکی هەژاران و نەداران نەبوو؟ کێ ئەوەندەی (موفتی زادە) خاوەنی پەیام بوو؟ هەر لەبەر پەیامی ئاسمانی نەبوو ئەوەی بەسەردا هێنرا؟ جا ئەمە مانای ئەوە نییە، کە ئەویش پێغەمبەرێکی خوایی بوو، نا مەقامی پێغەمبەران لە شوێنێکی دیکەیە و موفتی زادە لە مەقامدا لە پێغەمبەران جیاوازە، بەڵام لە پەیامدا هەمان پەیامی پێغەمبەرانی پێ بووە، بۆیە گرنگە لە دەرەوەی ئەم تێکەڵکردنە لەم بابەتە تێبگەین، کاتێك مرۆڤەکان دەبنە خاوەنی پەیامی ئاسمانی ئیتر ئاسمان دێتە خزمەتیان، هەموو دەزانین (هاوەڵانی ئەشکەوت) پێغەمبەر نەبوون، بەڵام لەبەر ئەو پەیامەی پێیان بوو ئیلهامی خواییان بۆهات و ئەشکەوتێکی بۆکردنە باخ و بە هەزاران ساڵ تێیدا خەوتن! (مریەمی پاکیزە) پێغەمبەر نەبوو، بەڵام لە میوەکانی بەهەشتی بۆدەهێنرێت! نمونەکان لە قورئاندا زۆرن و دەکرێتە بگەڕێینەوە بۆیان و بەوردی لە هۆکاری باسکردنەکانیان ورد بینەوە. بەم بەڵگانەش بێت گومانم نییە لەوەی حاڵی رۆحی (کاك ئەحمەد) لەئەوجی ئارامی و سەعادەتدا بووە! مەگەر خۆی نەیفەرموو: پێم مەڵێن ئازاد بوو، بڵێن مەرەخەس بوو، چونکە ڕاستە بە جەستە لە زینداندا بووم، بەڵام لە هەموو تان ئازادتر بوو..

[٥]) مەلا عبدالکریم مودەریس: خولاصەی تەفسیری نامی، چاپی یەکەم، ٢٠١١، ص٣٢٧.

ئەوان ناتوانن من لە نێوان چوار دیواردا زیندانی بکەن لە کاتێکدا من رۆحم ئازادە و رۆژانە پێنج جار مولاقات لەگەڵ خۆشەویستەکەی خۆمدا ئەنجام ئەدەم"، هەرکەسێك بتوانێت دیوە نادیارەکەی ئەم قسەیە کەشف بکات، دەتوانێ بزانێت (کاك ئەحمەدی موفتی زادە) چی پیاوێك بووە!! راستە ئەو لە ڕووی جەستەوەیە لاوازا بوو، بەڵام ئەوە حاڵەتی رۆحی بوو کە خۆی باسیکرد.

دووەم: زۆربەمان ئەم شیعرە (ئامی ئینفرادی)مان بیستووە و خوێندومانەتەوە، کە دەفەرمووێت:

((لە جەرگەی جەمی یارانی گیانیی  تۆم نەبێ هێشتا خۆم پێ‌تەنیایە

تۆم هەبێ تەنیا لە انفرادیی  لێم جەمە هەرچیی خۆشیی دنیایە))

دەزانین (کاك ئەحمەد) ئەمە بە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت، کە ئەگەر لە ئینفرادی لەگەڵیدا بێت هەرچی خۆشییە لەم دونیایەدا جەمە لەلای، واناژانم لەم بەڵگە ڕوونتر هەبێت! هەمیشە ئەوە سەرنجی ڕاکێشاوم: چ رۆحێك هەیە بتوانێت لە شوێنێك تارەکیك و نوتەك و وەحشەتناکدا شعری بەوجۆرە دەربڕێت؟ هەرکاتێك ئەم شیعرە دەخوێنمەوە (کاك ئەحمەد) دێتە بەرچاوم لەسەر لوتکەی شاخی (شینە شاهۆ) دانیشتووە و لە ئارامییەکی رۆحیدا دەینووسێت، چونکە وەك وتم ناکرێت ئەمە بەرهەمی بارودۆخی ئینفرادییەك بێت کە مرۆڤ تێیدا ناوی خۆیشی لەبیر دەچێتەوە!

بەم دوو بەڵگە دەگەینە ئەو بەرئەنجامە کەبەڵێ، کاك ئەحمەد لە زینداندا لە بەرزترین پلەکانی رۆح و مەعنەوییەتدا ژیاوە، کە ئەویش بەرئەنجامی خۆشەویستیی و عیشقییەتی بۆ پیاوچاکان و هەژاران:

لە بەینی هەرچی جۆرا، دوان هەن  خاسترو زووتر وە مەنزڵ ئەگەن:

یەك: خوەشەوییسیی خاس خواگەل، هەرکەس  لە هەر ئۆمەتێ یا رۆژگاێ هەس

وەك لە رەفێقیی چەفتا لا ئەدەیی  لە تەك رێکانا رەفاقەت بکەیی.

بخوێنەرەوە ئەحواڵی خاسان  بێژە و بییسە لە دەمی راسان.

جا ئەم موحیببەتە بەوە بەدەست دێتەوە، کە جیاوازی نەکەیت لە هەر میللەت و ئومەت و نەژاد و نەتەوەیەك بێت، تەنها ئەوە هەیە تۆ دەبێت پیاوی خاست خۆشبووێت، پاشان بۆ دەستکەوتنیشیان بە شوێنیدا بگەرێ و بخوێنەوە و بیبیسە با بۆتی باس بکەن، هەروەها لە هاوڕێتەی چەوت و لارەکان لابدەیت و لەگەڵ پیاوچاك و ڕێکانا هاوڕێیەتی بکەیت...

دوەم: محبەت هەژار و فەقیر          کە بۆ صەفای دڵ، راس وەسە "ئیکسیر"
بە هەرچی جۆرە تێکۆشە تاکەی          دڵ وە محبەت هەژاران بگەی
بە گیانەکەی خۆت قەسەم رۆڵە گیان  خۆشەویسیی و خزمەت بێدەستان،
دڵ ئەکا وە ماڵ خوداو پێغەمبەر     شەیتان لە کەوشەن دڵ ئەکاتە دەر

لەبەرئەنجامی ئەم خۆشەویستیە، کە (موفتی زادە) خۆی ئەزموونی کردووە و تامی چەشتووە، دڵ دەبێتە مالّی خوا و پێغەمبەر!! ئەمەش دووبارە دەبێتە پشتراستکردنەوەی دوو بەلگەکەی سەرەوەمان....

بەلاّم دەبێت بزانیت ئەمە تەنها بە قسە و رواڵەت نییە، دەبێت هەولّبدەیت و فیز و تەکەبور و غرورییەت کەناربخەیت، گەورەی بە خوا بسپێریت و سەرت بۆ هەژاران نەوی بکەیت! دەبێت هەروەك چۆن خێزان و ئەزیزانت خۆش دەوێت بەوشێوەیەش هەژارانت خۆشبوویت:

بەلاّم بزانە: بە تەنیا زوان          یا بە رواڵەت، دڵ نابێ بە کان
بزانە: هەچی گەورەو گرانە          وە دەس هێنانی، سەخت و گرانە
بزانە: ئەبێ خۆشوییسیی تۆ          پڕ بە دڵ بێ، وەك بۆ خێزان و خۆ

تا ئێرا شەرحی حاڵ و ئەحواڵی و جۆر تامی خۆشەویستی کرا، لێرەبەدواوە (کاك ئەحمەد) دێت ئەو هۆکار(وەسیلە) دیاریدەکات کە ئێمە بە هۆیانەوە دەتوانین بگەین بە خۆشەویستی و، موحیبەتی هەژاران بە دەست بهێنین و بچێتە دلّمانەوە، چونکە وەك وتمان کاتێك توانین ئەو خۆشەویستییە بەدەست بهێنیت ئەو کاتە دلّت دەبێتە مەماڵ و مەکۆی خوا و پێغەمبەرەکەی(ﷺ)...:

جا بۆ ئەوە ئەو خۆشەویسیە          ببێتە گیانیی، وەسییلە چیە؟
١- یەکەم وەسییلە، رێ جۆرکردنە          ژیا، بەرەو بار هەژار بردنە.

یەکەم هۆکار بۆئەوەی خۆشەویستی بچێتە دڵەوە ئەوەیە، کە تۆ ڕێگەی بۆ خۆشبکەیت، ئەمەش بەوە دەبێت ژیان بەرەو بارە هەژاران بەریت و خۆت لە هەموو دەعییە و دەمار و خۆ بەگەورە زانینێك بە دووربگریت و لە خۆتیان دورخەیتەوە، پاشان دەزگای ئەشرافی و زەرق و بەرق لە ناوبەریت و ناز و نیعمەت نغرۆت نەکەن، چونکە ئەم دوو دەردە زۆر ترسناکن و دەبنە هۆکاری ئەوەی دەروونت ببێتە مەکۆی شەیتان، ئەوانیش:

یەکەم: خۆ بەزلگرتن و غروریی و تەکەبور.

دووەم: دەزگا و سفرەی پڕ زەرق و برق.

دوو نەخۆشیی هەن بۆ گیانی انسان   نەك هەر محببەت حەتتا بۆ ئیمان
بە گیانت ئەو دوو "دەردە چەپەڵە"   بۆ بێسانی دڵ، هەر وەنە کەڵە
ئەپێچێن لە دەور هەچی کە جوان بێ   هەر خۆیی بەرەو بار ئیمان بێ،
تا زەردی نەکەن نەیخەن لە گەشە   مەحاڵە دەس بەریەن لە یەخەی
یەك: دەعیە و دەمار، خۆ بە زل گرتن   ئارەزویی بان بوون لە مەردم کردن
دوو: دەمو دەزگای پڕ لە زەرق و بەرق   خۆ لە ناو نازو نیعمەت کردن غەرق.
گەرەکتە جۆریێ بەرەو خوا چوونت   نەبێتە مەکۆ شەیتان دەروونت،
بە نییەتێکی ڕێك و پاکەوە،   بەرەو لای ژیینی هەژار لاکەوە
پاکەوە سفرە و پۆشەن و ماڵت   مەبەست و هیێواو خوو و ئەحواڵت،
لەو دوو پییسیە، تا ئامادەبیی   بەرەو خۆش ویستن هەژاران بچیی
دەنا، تا زلیی‌و خۆشگوزەرانیی   مەبەستە، نابیە زانای ئیمانیی.
بەڵام نەك لەبەر تەمەڵیی، لە کار   لادەیی، بۆ هەژار بوویتە سەربار
ئەبی لێ هاتی دەعیە و، هەبێ   ئەمجا "جوان ژیان" قازانجی ئەبێ
جا، خۆ وە هاوشان خەڵکی هەژار بکەیی،   ماڵت بۆ خەرجی خودا پەسەن بەیی

زۆربەی موفەسیرینی قورئان، کاتێك دەگەنە ئایەتی﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴾{المدثر٤}، دەفەرموون: واتە جلەکانت پاك بکەرەوە و پاو خاوێن ڕایانبگرە.... بەڵام ئەوە (کاك ئەحمەدە) دیوە نادیارە و مەبەستە قوڵەکەی ئەم ئەیەت و سورەتە کەشف دەکات! ئەو ئایەت بڵێت ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴾ واتە

پۆشەن و جلو بەرگەکانت پاك ڕابگرە، وەك خۆی دەفەرموێت: ئاخر ئەم سورەتە سورەتێکی ئینقلابییە، ئەصلّەن کەی ئەم باسی پاك و خاوێنییە لێرەدا کرێت؟! بە بڕوای (کاك ئەحمەد) لێرەدا بانترین فەرمان انقلابییە، و قەسە لەسەر ئەوەیە کە دەبێت محەمەد(ﷺ) ئەشرافییەت و خۆش ڕابواردن و جل و بەرگی پڕیەرق و زەوق فڕێ بدەین و دەست بکەیت بە لە خەو هەڵساندنی خەڵکی و وێڵەکان بخەیتەوە سەر ڕێگەی ڕاستی خۆیان. مەزڵوم و داماوەکان ڕزگار بکە لەدەس زاڵم و ستەم کار، خۆت لە منتە و خۆ بەگەرە گرتن دورخەیتەوە، جا بۆ ئەوەی ئەوەبسەلمێنێت کە لێرەدا قسە لەوەنییە جلو بەرگ پاك و تەمیز ڕابگرێت دێت دوو بەڵگە دەهێنێتەوە، دەفەرموێت: یەکەم، لەناو دەستورگەلێکی ئاوا گەروە و گران، کەی باسی پاك و تەمیسی ڕەوایە؟ دووەم، خۆ حەزرەت (ﷺ) ئێستا تەمەنی گەورەیە و ئێستا جلی پاك و تەمیس لەبەر دەکات، ئەگەر لە دەورانی منداڵیدا بە هۆی هەتیوی و شوانییەوە کەمێك جلەکانی درابن خۆ ئێستا ئەوەش نەماوە، ئێستا حاڵی زۆر باشە و بازرگانی دەکات و پارەی هەیە بۆئەوەی جلی باش لەبەربکات و پاوك و خاوێن بێت. دەفەرموێت ئەصلّەن کاتێك حەزرەتی جبرەئیل(سەلامی خوای لێبیت) فەرمانەکەی بۆ هێنا، شتەکان پێچەوانە بوونەوە، ئەگەر ئەوسا دوای ژن هێنان جل و بەرگ و پۆشەی جوان و بوو، هەر ئەو ئەمرەهات گشتی وەلانا و چووە دۆخی هەژاران و جل و بەرگی سادەی لەبەرکرد، جلەکانی ئەصلّەن بەجۆرێك کۆن بوون، ئەگەر کۆنە کرێك بچووایە بۆلای لەبەر خراپی جلەکانی لێنەدەکرێ، بە پێچەوانەی ساڵانی ڕابردووەوە وای لێهات کاتێك دەچووە مەجلیسێکەوە نەدەگەڕا بە شوێن جێگەدا، بەڵکو لە هەرشوێنێکدا جێگە هەبوایە دادەنیش، وەك حەماڵان لەسەر زەوی خوڵاوی بەبێ فیز ڕادەکشاو خۆی جیا نەدەکردەوە، زۆرجار لەجیاتی سفرە و خوان دادەنیشت و لەسەر ڕانەکانی نانی دەخوارد...

ئەوسا لە ئیسە ناحاڵی تر بووم      مەعنای "فَطَهِّرْ"* بۆم نەبوو مەعلووم:
ئاخر یانی چیی؟ خاوێنیی پۆشەن،      کەی لێر بۆ باس ئەشیێ، ئەوەڵەن؟
سەرەتای سوورەی "مدثر"چیە؟      بانترین فەرمان انقلابیە:
لە جێو باڵێنی "ڕابواردن" لادان،      قیام و، خەڵکی خەواڵوو ڕانان،

---

*) {وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ} المدثر٤

لە خوا بەولاوە بە بووچك زانین،        لە ڕێزگرتنی "ناحەق" وازهانیین،
بیروڕای باوی غەلەتی وڵات        وێڵ کردن، بەلآم بە شێوەی خەبات،
منەت لە شوێنی خاسیا نەنان        (هەچەن مردوگەل نەگەیینە ژیان)،
لەبەر خوا هەزار عەزیەت و ئازار        برسیەتیی، تەبعیید وەبێ دارژیار،
هەموار کردن، تا مەزڵووم و داماو        ڕزگار بن لەدەس زڵم و ناحساو
لەناو دەیتوورگەل وا گەورەو گران        باس جە تەمییسی سییپاڵ کەی ڕەوان؟
دووەم: خۆ حەزرەت محمد(ص) ئیسە چەن ساڵە، بەرگی، باش و تەمییسە
ئەگەر دەورانی منالّی و جوانیی        بەکرێکاریی ئەی بواردو شوانیی،
ئەمە چەن ساڵە، دوای ژن هێنان،        وەزعیی جۆری هەس نەك وێنەی جاران
دەی خۆ تا جبریل(ع)ئەو ئەمرەی        هانیی پۆشەنی، چوەو دۆخەکەی جوانی!
ئەگەر چەن ساڵ بوو وەك خەلکی سەرناس   لباس، شۆڕ بوو لە کوتالگەل خاس،
لەبەر تەمییسیی، بەرقی ئەداوە        هەر ئەو ئەمرە هات، گشتی نا لاوە
ئیتر پۆشەنی سادە و هەرزان بوو        زۆرتریش شەڕوال وەك هەژاران بوو
مەگەر دیاریی، ئەر نە لەوەو لا        پوشەنێکی نەوو کۆنەسێن بی با
لەسەر خاکەوە بەرعەکسی سالآن        دائەنیشت، ئەوخەوت هەر وەك حومالآن
زۆرجار لە باتیی سیینیی و سفرە و خوان  وەك بەردە لەسەر داوێن ئەیخوارد نان
داوێن پارچەی وەك متقال و جاوە        کۆتا بوو لە ژوور قووزەکی پاوە

ئێستا کاتی ئەوەیە بزانین ئایەتی (فَطَهِّرْ) یانی چی:
دەستووری ئایە و، وەزعی ئیسە و زوو   لە لام هەر ئەت وت موعەمایێ بوو
پاشان تێگەییم " فَطَهِّرْ " یانی:        بەرگی ئەشرافیی، پیسە، وەلانێ
یانی: وەك لە ژوور، فامو خۆ، لە دەر        دەرێنە پۆشەن پووڵ و پۆز لە بەر
واتـە: بـەرگی ئەشـەرافی پیشـە و لایبـەرە، هـەموو ئەوشتانەی بـۆنی دروسـتکردنی تەبـەقات و چینایەتی لێدێت فرێیبدە.

یانی: ڕێگەیێ کە لە بەرتایە ڕێ کاملّ بوونی دینی خودایە
"هەرچی نەختێ بۆی ئەشرافی لێهات ناخوئجێ لەتەك ڕێگەی لەمەولات"

واتە: ئەو ڕێگایەی لەمەولا لەبەردەمتایە و هەنگاوی لەسەر دەنێی، ڕێگەی بە کەماڵ گەیاندنی دینی خوایە، ئەم ڕێگەیەش تەبیعەتی وایە هەرشتێك کەمێك بۆنی ئەشرافی لێبێت ناگونجێت لەگەڵیدا و رەدی دەکاتەوە، چونکە بە بۆچوونی (کاك ئەحمەد) ئەرکی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر و دینی خوا ئەوەیە کە تەبەقات و بانو خوار لەناو کۆمەڵگەدا نەمێنێت و هەر بۆ ئەمە هاتووە..
((یانی: هەمییسان لە وێنەی جاران جۆر کەوە شێوەی ژیینی هەژاران))
ئەم ئایەتە واتە: دووبارە وەك جاران خۆت جۆرکەوە لەگەڵ هەژاران و بەوشێوە بژی کە ئەوان دەژین، بە مادە و مەعنەویت خۆت جۆربکە لەگەڵیان. ئەگەر لەم ماوەیە حیکمەتی خودا ئەوە بوو وەك دەوڵەمەنەکان بژیت تەنها لەبەرئەوەیە ئەو ژیانەش ئەزموون بکەیت، هەروەك چۆن هەتیوی و بازرگانی و سەربازی و .... هەموویت ئەزمونکرد، ئەوەش ئەزموون بکە، ئێستا کە ئەو قۆناغەشت زانی بگەڕێرەوە سەر دۆخەکەی جاران و دەستی هەژاران و نەداران بگەر و بیان پەڕێنەوە:

ئەر حیکمەتی خوا وا بوو کە: ژیینی وەك دەوڵەمەنیش، بەینێ ببینینی،
ئیتر تێگەین لە حاڵ ئەو لایەش بادەوە بەرەو هەژار و بێبەش
ئیسە بە کەڵکە ژیینی سادە، بۆت کە ئەولا وێلکەیت خۆت بە مەیلی خۆت
تا وەك "بەرەحمەت موحتاجان" نەبیی چۆن"رحمة للعالمین" ئەبیی؟

**هۆکاری دووەم** بۆ ئەوەی خۆشەویستی بەسود و بەرەکت بێت بۆ خەڵکی هەژار، بریتییەلەوەی لەگەڵ ئەم چینە دەردەدارە خۆت بگونجێنیت و سەردان و هەواڵپرسینیان زۆرکەیت، جا (کاك ئەحمەد) لێرەدا ئاگادار کردنەوەیەکی گرنگ پێشکەش دەکات، ئەوییش ئەوەیە کاتێك سەردانیان دەکەیت و هەواڵیان دەپرسیت وانەڕۆیت وەك ئەوەی تۆ گەورەیت و بۆلای بچوکێك دەچیت، بە پێچەوانە دەبێت وا بڕۆیت کە تۆ دەردەداریت و سەردانی حەکیم دەکەیت، ئەوان بە حەکیم و خۆت بە موحتاجی سەردانیان بزانیت، وا رەفتار بکەیت ئەگەر نەچیت بۆلایان ئەوە تۆیت زەرەر دەکەیت بە ئازادرەوە دەتلێیتەوە نەك ئەوان! جگە لەوەش دەبێت ڕووخۆش و بە خەندەبیت

لەگەڵیان، زانایان مامەڵە بکەیت، ئەگەر عەیبێکت بینی چارەی بەکەیت بە جوانترین ئەدەب و ئیحترامەوە، جا لە کۆتایی بەیتەکەدا دەفەرمووێت: خوا یار و پشتیوانت بێت کارێکی بەم شێوەیە زۆر سەختە، چونکە دەبێت لە لایەکەوە دەردەدارییت و سەردانی حەکیم بکەیت، لەلایەکی دیکەوە حەکیم بیت و عەیب و نەزانینەکان چارە بکەیت:

٢- وەسیلەی دوەم کە خوەشەویسییت   بۆ هەژار، بیی بێ بەرەکەت و پییت:

خۆ لە تەك چینی هەژاران، جۆرکە   دۆسیی‌و هاتووچۆ لە تەکیان زۆرکە

بەلاَم وریای ناخ دەروونت ببی:نەك وەك گەورە بۆ لای بووچك بچیی

ئەحواڵت هەروەك دەردەداری بێ   بۆ لای حەکیمان ئەچێ

لەتەك ئەو چینا ببە بە هاوراز   بە رەفاقەتێ ڕاس و گەرم و ساز

وەها، لە بەینا هەر تۆ نەمێنی   ئیتر من من و تۆ تۆ نەمێنێ

لەتەك ئەوییشا، مەبەستێتر هەس   وریابە تا لێت نەشێوێ مەبەس:

هەرمادی نیە دەردی ئەوێ چیین   زۆرێ کەم بەشن لە خدە و زانیین

ئەبێ دانسقە و وریای رێ دین بی   تا ئیشتبایێ یا عەیبێکت دیی،

تووشی نەبییت و: بەشێوەیی جوان   نەك بە رەوشتی خودخواهی نەزان

ئەتۆش خزمەت کەیی بە هاوەڵی خۆ   بە باش کردنی تێگەیین و خۆ

جا خوا یارت بێ، سەختە وا کارێ:   هەم حەکییمێ هەم دەردەدارێ

وەسیلەی سێهەم لەم ڕێگایە بۆنەوەی بتگەیەنێت بە خۆشەویستی، دەبێت کاربکەیت، بخوێنیتەوە، دەربارەی پیاوچاکان عیلم کۆکەیتەوە، سیرەی محەمەد(ﷺ) و یارانی (ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی)، هەمووی بهێنیت پەندوەرگریت، تەماشایی ژیانی خاوان صەفا و ماڵ و سامانەکانی وەك(عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) بکە. ئەوان بکە سەرمەشق و مورشیدی خۆت، وەك ئەوان بژی بۆ ئەوەی ببیتە خۆشەویستی دڵی هەژاران:

٣-وەسیلەی سیەم: لە شەرحەحاڵی   پێغەمبەران و خاسان بیی حاڵی

کە چۆن هاوڕەنی هەژاران ئەژیان   بێ دەعییە و نازو دەزگاو سفرە و خوان

تماشای ژیان حەزرەت پێغەمبەر(ص) یا ئەبوبەکر و عەلی و عومەر ـ ع ـ

یا لەخێڵ شاگەل بە دەمارو فیز   تەماشایی عومەر کوڕ عەبدولعەزیز ـ ع ـ

لەم باسە جوانە دەروون گەشێنە هەرچی نووسراوەی باش بوو بیبخوێنە
هەتا بتوانیی: هەوەسی نەوپی سونك کەیی، بەرەو رێ خوا سەرکەوپی
خۆشە: لە دنیاو قیامەتا هاورەن پێغەمبەر بیی، نەك برێ دیەن تەن
دڵ دان بە حاڵی ناکەسگەلیش زۆر بە کەڵکە ئەر باس بەچەشنێ بێجۆر

دوای ئەمانە جارجارەش گوێ رادێرە بۆ بەیت و شیعری جوانی دڵ هەژێن، بۆئەوەی مەنجەڵی دڵ بێتە کوڵ و ئەو حاڵە ئیمانییە ئارام و ناسکەت بۆ دروست ببێت، کە هەرساتێکی پلە پلە بە رەو خوا نزیکت دەکاتەوە و تامی ئیمانت پێدەنۆشێت!

((با جار جارێکییش صالحی دەن خۆش دەروون وە ئییمان پڕ جۆش و خورۆش
بە خوێندنەوەی بەیت و شیعری جوان مەنجەڵی دلآن بێنێتە کولآن))

جا لەکۆتایدا توانیت ئەم هۆکارانە بگریتەبەر و سەرکەوتووبووت، ئەوا بە دۆعای خێر یادی بکەیت و لە نزاکانت بێبەشی نەکەیت، هەوەك (مامۆستا سەعیدی نوورسی) دەفەرمووێت: "هەمیشە موحتاجی نزای خێری هاوڕێیان". ئەویش دەڵێت موحتاجی دۆعاتانم و لەیادم مەکەن.

جا ئەوکاتەی وا دڵت کوڵ تێرێ یادی براتکە وە دۆعای خێرێ
دڵگەل پڕ گەشە و مەجلیس پڕ نووربێ مەلایکە نزییك، شەیاتین دووربێ
فەزای دڵ، وێنەی هەوای کوردستان خەوش کا رەحمەت و بەرەکەتباران:
بۆ هەژار لاوێن لە زاڵم بە سام پێغەمبەری خوا صەڵوات و سەلام.

بەمشێوە (کاك ئەحمەد) بەو بەهرە خواییەی پێیدراوە، ئەو وانە جوانە دەڵێتەوە و دوای خۆی بۆ هەمیشەی بەجێیدەهێڵێت.

## ئیکسیری گەورە*

ڕۆڵەم هاوڕێیەی دنیا و قیامەتم　　بە دڵ گوێ بگرە بۆ نەسیحەتم
ڕازرێ، تازە من دوای پەنجا ساڵ　　تێگەییم، ئەویش بە حاڵ و نەحاڵ
خۆشە تۆ هەرتا جوانی حاڵی بیی　　تا پوختە و قاڵی موسوڵمانی بی

---------

ڕۆڵەم ئەزانی: لە دوای تێگەیین　　بە دڵە زۆردارو بە تیین
بەڵام چ ڕازە: برێ دڵ، سازن　　بۆ قەبوڵی حەق، برێ لەجبازن؟
برێ ئەخلاق، یان قسە، یا ڕەفتار　　یا ڕەفاقەت، یا عادەت، یا ژیوار
مایەی نەخۆشیی یا ساقیین بۆ دڵ　　لادان لە زۆریان گرانە و موشکڵ
چتێ کە لە ناو ئەوانا گشتی　　جوانترە و زۆرتر بردو بڕشتی،
"خۆشەویسیی یە"و، لەوەلا نییتر　　ناگاتە گەردی پایا هیچی تر
هەروەك دڵێ چۆڵ لە خۆشەویستی　　نامادەس بۆ صەد نەخۆشیی و پیسیی

----------

ڕۆڵەی هاوڕاز و هاو گرفتاریم　　پێم وایە: تەواو دەرس و مۆچیاریم
گشتی هاوقیمەت هەر یەك کەلیمەس‌یانێ"محبت"، ئەرزش گشتی هەس
محبت هەر کەس یا هەرچ کەبێ　　بەو شەرتە: "تەنیا غەریزی" نەبێ
چوونکە خۆش ویستن ئەر هەر غەریزییس　　لە حەقیقەتا لە بەر"خۆویستیی"س
زۆرن محبت کە لە خۆ ویستیین　　بۆ گەل، بۆ وڵات، مەزهەبن حەتا دیین!
برێ بەش لە ئەو نوورە نەبردوو　　لە ناو دوکەڵی هەوەسا ون بوو
خوا و پێغەمەری "خو"یان خۆش ئەوێ　　ئەر خۆش ویستنیان بە درۆ ئەوێ

------

لە دوای ئەو شەرتە وریابە لە دوا　　عەقڵی ڕێ شێواو نارەزوو لێ داو،

---

*) خوێنەری خۆشەویست، بۆئەوەی بەیتە شیعرییەکە وەکخۆی و بەسەر یەکەوە بیخوێنێتەوە، کەبێ‌گومان تام و چێژێکی تایبەتی هەیە بیخوێنێتەوە و لەوەش بێبەش نەبیت، لەم کۆتاییەی کتێبەکەدا هەموو شیعرەکەمان بەسەریەکەوە دابەزادووە.

عەقڵی گزیری غەریزەی جادوو  عەقڵی تەن و مەن و ترازوو،
بە"جەدەل"سەرت لێ نەشێوێنێ  بە فێڵ قولت لێ بە فول نەنوێنێ

----------

تاخ لە جێ ئەو گش حەچەل و قالە  بفامیای ئەم چەنای چەن سالە:
تێکۆشم: خۆم و هەموو هاوالێ  بە"خۆشەویسیی"بگەین نەختالێ
ئەڵبەت نالێم ئەو باسانە زیادین  بەلام بە بایەق لە پلەی دواین:
لە دیینا"تعلیم" پایەی ئەسلی یە  وەلێ جێگەی وا لە پاش "تزکیە"
ئاخر ئەزانی: نادروسن هەر چەن  زۆتر بزانێ زیاتر ئەددا پەن

--------

بە هەرحاڵ هیوای قەرەویی هەر هەس  "ماسیی هەر وەختێ بیگریی هەر تازەس"

---------

گیانە دوو ڕیان کافری و ئیمان  چ بۆ کەم حاڵی چ بۆ فرەزان،
خۆ بە ئەزانیین یا زانیین نیە  بەڵکە بە انصاف یا لاساری یە
خوا بە کسانێ، "کافر"یا"مؤمن"  ئێژێ، حەساویی لە حەق حاڵی بن
یانی: تا پلەی"لە حەق تێ‌گەیین"  ئیمان و کافر، لە یەك جیا نیین
پاش حاڵی بوونە، یەکێ هەوەسی  ئەی کێشی بەرەو باری ناکەسیی
یەکتر، دڵی، دییل هەوەسگەل نیە  ئامادەی قەبوڵ حەق و ڕاسی یە
ئەگەر دڵ بدەیی بە باسی قورئان  "کافر" کەسێکە لە زلەیی مان
جا یا هەر ئیسە عاقوڵ و زلە  یا بۆی ئەپێوێ پلە وە پلە
چونکە ئەوییەنی ئەر ئیمان بێری  ئەشێ"گەورەیی" بە خوا بسپێری
ئەبی ببێتە هاوشان هەزاران  توێڵ بنێیتە جێ‌پێ ئەداران
"کما امن السفها"ت ژنەوت  لە دەم ئەفامگەل زلە دەرکەوت ـ
ئەنجا، لە ناحەق، نادا وچانێ  چونکە حەق، بۆ خوەی، وەشەڕ ئەزانیی

--------

{ جا هەر چەن تەنیا دەسەی "مترفیین" لە هەر دەورانێ دوژمنن بۆ دین

چۆن بۆ ئەتبینی: لە "مکە" زۆریَ تا بەینیَ ئیمان نایرن، وە جۆریَ؟
زۆربەی لە خەڵك، لە ترسی زۆرکار ناوێرن بچن بەرەو حەق یەکجار
یا رێك ناکەویَ: لە سامی دژمن بۆ مەبەستی حەق جارجار گویَ بگرن
یا هەر سەفسەتە و درۆی دەسدارگەل لە حەق، کول ئەکا چاوی عەقڵی گەل
کارێکیان ئەکرد: بە"پێشداوەری" مەردمیش بکەن لە حەق بێوەریی:
بۆ قسەی"شاعیر"،"جادوگەر"،"شێتگەل" کیَ حازرە خۆی بخاتە حەچەڵ؟]

-------

بەلاَن ئەوی تر، هەوای "زلەیی" یانیە، یاکەی نای کا کەلەیی
کە تیَگا لە حەق، یا خاو یا بە تاو بۆی ئەچیَ، ئەکا چش لە نانو ئاو

-------

بۆ یەکیَ وایەو یەکیَتر ئاوا؟ تەنیا مەسەلەی"دڵ"ە ئاوا:
هەر ئەنازە دڵ، ناساق یا ساق بیَ سیین ئەکا یا خۆ بەرە و حەق ئەچیَ
(نەك تەنیا کوفر و ئیمان، تەواوی بە دڵە: باری "خاسی و خراوی")
لە ناو هەرچێکا لە دڵ بە کارە "محبت" لە گش زۆرتر زۆرداره
تییشکی محبتَ دڵ ئە کا پڕ بار لە: ئەخلاقی باش، ئیمانی تەیار
پێت وانەبیَ: بیَ خۆشەویسی خوا لە ماڵی دڵ"ئیمان" هەڵ بکا
کەوا بوو، رۆحی مەبەستە: هەڵ بوو چرای "محبت" لە دڵ و دەروون
وەك لە مەسەلەی کوفرو ئیمانا زۆرتر مەردمان وە جۆرجۆر دانا،
بۆ کەحەببەتیش مەردم جۆرجۆرن: کرژ یا خاو، بەشدار لە کەم یا زۆرن
چی بکەین: بڵێسەی خوەشەوییسیمان زۆر بگریَ: قڵ کاو، زۆردار کا ئیمان؟
رەنی خوخواهیی، سسیی، ناپاکیی بە سەیقەلی دڵ، پاکەوکا پاکی؟
"هەر بە ـ محبت ـ لە گشتیی زۆرتر سووسەی محبت ئەوێتە ئاگر"
چوونکە دڵیش وەك عەقڵ و لەش، کەم کەم لە هەر بارێکەوە، خوەی ئەکا مەحکەم
بە خوەشەوییسیی بچووك فێرببیی ئەتوانی: بەرەو لای گەورەیش بچی

برێ عارفگەل ـ خوایان لێ ڕازیبی ـ وا ئەڕوانن بۆ عەشقی مەجازیی:
بە مەجازی ئالوودە نەبیی دڵ، بۆ حەقیقیی ئامادە نەبی.
(بەلاَن ئیشتبان باوڕت یەبۆ: "حەقییق بێ مەجاز، تاقییق نەبۆ"
هەر محەبەتێ نا پەسەن نەبێ ئەگونجێ بەرە و حبی خوا بچێ
هە وەك ئەگونجێ: دڵی کۆك و ساز بگاتە ئاوات بێیاریەی مەجاز)
ئەلغەرەز، ئەگەر بە ئاواتی: دڵ، بە خوەشەوییسیی جوانتر بی لە گوڵ
قاڵ بی بە حبی خودا و پێغەمبەر تا چە پییسیە، لێ بچێتە دەر،
کەم کەم نێکۆشە تا وە محبت لە بووچکترەو، دڵت بەبی عادەت.
لە بەینی هەرچی جۆرا، دوان هەن خاستر و زووتر وە مەنزڵ ئەگەن:
یەك: خوەشەوییسیی خاس خواگەل، هەرکەس لە هەر تۆمەتێ یا ڕۆزگایێ هەس.
وەك لە ڕەفیقیی چەفتا لا نەدەیی لە تەك ڕێکانا ڕەفاقەت بکەیی.
بخوێنەرەوە ئەحواڵی خاسان بێژە و ببیسە لە دەمی ڕاسان.
دوەم: محبەت هەژار و فەقیر کە بۆ صەفای دڵ، ڕاس وەسە "ئیکسیر"
بە هەرچی جۆرە تێکۆشە تاکەی دڵ وە محبەت هەژاران بگەی
بە گیانەکەی خۆت قەسەم ڕۆڵە گیان خۆشەوییسیی و خزمەت بێدەستان،
دڵ ئەکا وە ماڵ خوداو پێغەمبەر شەیتان لە کەوشەن دڵ ئەکاتە دەر
بەلاَم بزانە: بە تەنیا زوان یا بە ڕواڵەت، دڵ نابێ بە کان
بزانە: هەچی گەورەو گرانە وە دەس هێنانی، سەخت و گرانە
بزانە: ئەبێ خۆشوییسیی تۆ پڕ بە دڵ بێ، وەك بۆ خێزان و خۆ
جا بۆ ئەوە ئەو خۆشەوییسیە ببێتە گیانیی،وەسییلە چیە؟
١- یەکەم وەسییلە، ڕێ جۆرکردنە ژیا، بەرەو بار هەژار بردنە.
دوو ئەخۆشیی هەن بۆ گیانی انسان نەك هەر محببەت حەتتا بۆ ئییمان
بە گیانت ئەو دوو "دەردە چەپەڵە" بۆ بێسانی دڵ، هەر وەنە کەڵە
ئەپێچێن لە دەور هەچی کە جوان بێ هەر خۆیی بەرەو بار ئییمان بێ،
تا زەردی نەکەن نەیخەن لە گەشە مەحاڵە دەس بەریەن لە یەخەی

یەك: دەعیە و دەمار، خوا وە زل گرتن ئارەزووی بان بوون لە مەردم کردن
دوو: دەمو دەزگای پڕ لە زەرق و بەرق‌خۆ لە ناو نازو نیعمەت کردن غەرق.
گەرەکتە جۆرێ بەرەو خوا چوونت نەبێتە مەکۆ شەیتان دەروونت،
بە نییەتێکی ڕێك و پاکەوە، بەرەو لای ژیینی هەژار لاکەوە
پاکەوە سفرە و پۆشەن و ماڵت مەبەست و هیبیواو خوو و ئەحواڵت،
لەو دوو پیسیە، تا ئامادەبیی بەرەو خۆش وییستن هەژاران بچیی
دەنا، تا زلیی‌و خۆشگوزەرانیی مەبەستە، نابییە زانای ئیمانیی.
بەلاّم نەك لەبەر تەمەڵیی، لە کار لادەیی، بۆ هەژار بوویتە سەربار
ئەبی لێ هاتی دەعیە و، هەبێ ئەنجا"جوان ژیان" قازانجی ئەبێ
جا، خۆ وە هاوشان خەڵکی هەژار بکەیی، ماڵت بۆ خەرجی خودا پەسەن بەیی

ئەوسا لە ئیسە ناحاڵی تر بووم مەعنای"فَطَهِّرْ"*بۆم نەبوو مەعلووم:
ئاخر یانی چیی؟ خاوێنیی پۆشەن، کەی لێر بۆ باس نەشیێ، ئەوەڵەن؟
سەرەتای سوورەی "مدثر"چیە؟ بانترین فەرمان انقلابیە:
لە جێو باڵێنی "رابواردن" لادان، قیام و، خەڵکی خەواڵوو ڕانان،
لە خوا بەولاوە بە بووچك زانین، لە ڕێزگرتنی ناحەق" وازهانیین،
بیروڕای باوی غەڵەتی وڵات وێڵ کردن، بەلاّم بە شێوەی خەبات،
منەت لە شوێنی خاسیا نەنان (هەچەن مردوگەل ئەگەیینە ژیان)،
لەبەر خوا هەزار عەزیەت و ئازار برسیەتیی، تەبعیید وەبێ دارژیار،
هەموار کردن، تا مەزڵووم و داماو ڕزگار بن لەدەس زڵم و ناحساو
لەناو دەیتوورگەل وا گەورەو گران باس جە تەمییسی سیپاڵ کەی ڕەوان؟
دووەم: خۆ حەزرەت محمد(ص) ئیسە چەن ساڵە، بەرگی، باش‌و تەمییسە
ئەگەر دەورانی مناڵی و جوانیی بەکرێکاریی ئەی بواردو شوانیی،
ئەمە چەن ساڵە، دوای ژن هێنان، وەزعیی جۆری هەس نەك وێنەی جاران

---

*) {وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ}المدثر٤

دەی خۆ تا جبریل(ع)ئەو ئەمرەی هانیی پۆشەنی، چوەو دۆخەکەی جوانی!
ئەگەر چەن ساڵ بوو وەك خەڵکی سەرناس لباس، شۆڕ بوو لە کوتاڵگەل خاس،
لەبەر تەمیيسیی، بەرقی ئەداوە هەر ئەو ئەمرە هات، گشتی تا لاوە
ئیتر پۆشەنی سادە و هەرزان بوو زۆرتریش شەڕوڵ وەك هەژاران بوو
مەگەر دیاریی، ئەر نە لەوەو لا پوشەنێکی ئەوو کۆنەسێن بی با
لەسەر خاکەوە بەرعەکسی ساڵان دائەنیشت، ئەوخەوت هەر وەك حومالان
زۆرجار لە باتیی سینیی و سفرە و خوان وەك بەردە لەسەر داوێن ئەیخوارد نان
داوێن پارچەی وەك مَتقاڵ و جاوە کۆتا بوو لە ژوور قووزەکی پاوە
دەستووری نایە و، وەزعی ئیسە و زوو لە لام هەر ئەت وت موعەمایێ بوو
پاشا تێگەییم " فَطَهِّرْ " یانی: بورگی ئەشرافیی، پیسە، وەلانێ
یانی: وەك لە ژوور، فامو خۆ، لە دەر دەرێنە پۆشەن پووڵ و پۆز لە بەر
یانی: ڕێگەیێ کە لە بەرتایە ڕێ کامڵ بوونی دیینی خودایە
"هەرچی ئەختێ بۆی ئەشرافی لێهاتنا خونجێ لەتەك ڕێگەی لەمەولات"
یانی: هەمییسان لە وێنەی جاران جۆر کەوە شێوەی ژیینی هەژاران
ئەر حیکمەتی خوا وا بوو کە: ژیینی وەك دەوڵەمەنیش، بەینێ ببینینی،
نیتر تێگەین لە حاڵ ئەو لایەش بادەوە بەرەو هەژار و بێبەش
نیسە بە کەڵکە ژیینی سادە، بۆت کە ئەولا وێڵکەیت خۆت بە مەیلی خۆت
تا وەك "بەرەحمەت موحتاجان" نەبیی چۆن"رمحة للعالمین" نەبیی؟

٣- وەسییلەی دوەم کە خوەشەوییسییت بۆ هەژار، بیی بێ بەرەکەت و پییت:
خۆ لە تەك چینی هەژاران، جۆرکە دۆسییو هاتوچۆ لە تەکیان زۆرکە
بەلام وریای ناخ دەروونت بیی: نەك وەك گەورە بۆ لای بووچك بچیی
ئەحواڵت هەروەك دەردەداری بێ بۆ لای حەکیمان ئەچێ
لەتەك ئەو چیینا ببە بە هاوراز بە رەفاقەتێ ڕاس و گەرم و ساز
وەها، لە بەینا هەر تۆ نەمێنی نیتر من من و تۆ تۆ نەمێنێ

لەتەك ئەوییشا، مەبەستیٚتر هەس  وریابە تا لیٚت نەشیٚویٚ مەبەس:

هەرمادی نیە دەردی ئەویٚ چیین  زۆریٚ کەم بەشن لە خدە و زانیین

ئەبیٚ دانسقە و وریای ریٚ دیین بی  تا ئیشتبایی یا عەییبیٚکت دیی،

تووشی ئەبییت و: بەشیٚوەیی جوان  نەك بە رەوشتی خودخواهی ئەزان

ئەتۆش خزمەت کەیی بە هاوەڵی خۆ بە باش کردنی تیٚگەیین و خۆ

جا خوا یارت بیٚ، سەختە وا کاریٚ:  هەم حەکییمیٚ هەم دەردەداریٚ

۳-وەسیلەی سیەم: لە شەرحەحاڵی  پیٚغەمبەران و خاسان بیی حاڵی

کە چۆن هاوڕەنی هاژاران ئەژیان  بیٚ دەعییە و نازو دەزگاو سفرە و خوان

تماشای ژیان حەزرەت پیٚغەمبەر(ص) یا ئەبوبەکر و عەلی و عومەر ـ ع ـ

یا لەخیٚلیٚ شاگەل بە دەمارو فیز  تەماشایی عومەر کوڕ عەبدولعەزیز ـ ع ـ

لەم باسە جوانە دەروون گەشیٚنە  هەرچی نووسراوەی باش بوو بییخوێنە

هەتا بتوانیی: هەوەسی ئەوییی  سونك کەیی، بەرەو ڕیٚ خوا سەرکەوییی

خۆشە: لە دنیاو قیامەتا هاورەن  پیٚغەمبەر بیی، نەك بڕیٚ دیەنتەن

دڵ دان بە حاڵی ناکەسگەلیش زۆر  بە کەلکە ئەر باس بەچەشنیٚ بیٚجۆر

یا جار جاریٚکییش صاڵحی دەن خۆش  دەروون وە ئییمان پڕ جۆش و خورۆش

بە خوێندنەوەی بەیت و شیعری جوان  مەنجەڵی دلاٚن بێنێتە کولاٚن

جا ئەوکاتەی وا دڵت کوڵ تیٚریٚ  یادی براتکە وە دۆعای خیٚریٚ

دلگەل پڕ گەشە و مەجلیس پڕ نووریٚ  مەلایکە نزییك، شەیاتیین دووریٚ

فەزای دڵ، وێنەی هەوای کوردستان  خەوش کا رەحمەت و بەرەکەتباران:

بۆ هەژار لاوێن لە زاڵم بە سام  پیٚغەمبەری خوا صەڵوات و سەلام

پایزی ۱۳٦٥



رۆڵەکانم! هەرچی هۆکارە بۆ منداڵ ئەوەیە( باوك و دایك ) واقیعەن صاڵح و پاك بن، ئەگەر دایك و باوك هیچ نەڵێن و باسی هیچیش نەکەن بۆ منداڵ، تەنها خودی ئەمەی باوك رەفتار و حەرەکات و سەکەناتی و قسەگەلی، و دایك رەفتار و حەرەکات و قسەگەلی گشتی دروست و پاك و موبارەك بێت، خودی ئائەمە نوورە و دەرێژێت بەسەر منداڵدا و جیهەت دەداتە منداڵ، بۆیە لەپێش هەموو شتێکەوە ئەوە گرنگە خۆیان واقیعەن صاڵح بن.

چاپخانەی سیما